# پرسی بیست وشەشەم: ئەحكامە فیقهیەکانی کەسی مورتەد :

## یەکەم : هاوسەرگیریەکەی :

کەسی هەڵگەڕاوە هاوسەرگیریەکەی هەڵدەوەشێتەوە لە خێزانەکەی و واجبە لەسەر خێزانەکەی خۆی بەدوور بگرێ لێی، ئەگەر ڕازیش بێ بە کوفرەکەی ئەویش وەك ئەو مورتەد دەبێت، عەبدوڵای کوڕی زوبێر خێزانەکەی موختار سەقەفی دەکوژێت کاتێ ڕێگر دەبێت لە بەکافر زانینی هاوسەرەکەی.

## دووەم : منداڵی مورتەد : کافر کردن و بە کۆیلە کردنی :

_منالّی مورتەد کافر نابێت بەکافر بوونی باوکی.

_ناکرێ بە کۆیلە تاکو لەدایك نەبوبێت لەنێوان دایك و باوکێکی مورتەد ئەوکاتە حوکم ئەدرێ بە کافربوونی و دروستی کۆیلە کردنی.

## سێیەم : ماڵی مورتەد : ئایا دەبێتە خاوەنی ماڵەکەی :

قەولی ڕاست و دروست ئەوەیە ماڵی مورتەد بەدەستکەوت دەگیرێ.

بەڵگەی بردنی ماڵی مورتەد بریتیە لە بەسەرهاتی ئەو پیاوەی خێزانی باوکی مارە کردبوو هاوەڵانیش کوشتیان و ماڵەکەیان برد.

ئەو ماڵەی لەکاتی مورتەد بوونی پێی دەگیرێ بە موسڵمان بوونی ناگێردرێتەوە بۆی.

وە وتراوە بە موسڵمان بوونی دەگێردرێتەوە بۆی.

## چوارەم: میرات گرتنی و میرات لێ گیرانی : مورتەد بەهیچ شێوەیەك نە میرات دەگرێ و نە میراتیشی لێ دەگیرێ.

ئەگەر موسڵمانێك مورتەدببێتەوە میرات وەرناگرێ و بە مردنیشی منالّەکانی میراتی لێ ناگرن.

هەر وەك ئەگەر پیاوێك موسڵمان ببێت باوکی بمرێت میراتی لێ ناگرێ وە ئەگەر ئەم کوڕەشی بمرێت باوکی میرات لەم کورەی ناگرێ.

بەپێی گشتێتی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ( لايرث المسلم الكافر ولايرث الكافر المسلم ). رواه البخاري وە فەرموویەتی : ( لايتوارث أهل ملتين شتى ) رواه أحمد و أبو داود.

**پێنجەم : مامەڵە و گرێبەستە بازرگانیەکانی :**

زانایان بۆچونیان جیاوازە ئایا چاوەڕێ دەکرێ تا تەوبە دەکات یاخود چاوەڕێ ناکرێ .

**شەشەم : سەرپەرشتی کردنی منداڵەکانی بەشوودانی کچەکانی لە ئەستۆ نامێنێ.**

**حەوتەم: ئیمامەت و پێشنوێژی کردنی بەتاڵە ئەوەی لە پشتی نوێژبکات ئەبێت نوێژەکەی دوبارە بکاتەوە جا زانیبێتی مورتەدە یان نەیزانیبێ.**

ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی : ( منهم من قال ذلك لايصلي خلفه الجمعة و لاغيرها، إلا أنا لا ندع إتيانها ، فإن صلى خلفه أعاد )[1]

واتە : هەیە وتویەتی نوێژی جومعە غەیری ئەوەش لە پشتی ناکرێ، بەلام من ئەڵێم وازمەهێنن لە هاتنی نوێژەکان بەلام کاتێ لە پشتیانەوە نوێژتان کرد دوبارەی بکەنەوە.

وە بەربەهاری لە شەرحــی سونــە فەرموویەتی : ( إن كان إمامك يوم الجمعة جهميا وهو سلطان فصل خلفه و أعد صلاتك ).

واتە : ئەگەر ئیمامەکەت ڕۆژی جومعە جەهمی بوو و لەهەمان کاتتدا دەسەلاتدار بوو ئەوە نوێژ لە پشتیەوە بکە پاشان نوێژەکەت دوبارە بکەوە.

**یەحیای کوڕی مەعین** ئەفەرمێت : ئەوە من ماوەی چل ساڵە نوێژی جومعەم دوبارە ئەکەمەوە بەهۆی دەرکەوتنی جەهمیەکان لەسەر دەستی مەئمون .

**هەشتەم : دەسەلات و بەیعەتی هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر دەسەلاتداربێت.**

**نۆیەم : گرێبەستی ئاشتی لەگەل مورتەد :**

دروستە بەستنی گرێبەستی ئاشتی لەگەل کەسی مورتەد ئەگەر خاوەن هێز و دەسەلات بوو و موسڵمانان نەیاندەتوانی خۆیان لە خراپە و شەڕی بپارێزن.

**دەیەم: تاوانەکانی مورتەد :**

ئەگەر مورتەد تاوانی کوشتن یان زینا یان دزی لەسەر بێت پاشان تەوبە بکات باجی هەموو ئەو تاوانانەی هەر دەبێ بدات لەسەر قەولی ڕاست.

[1] السنة والإبانة.

_کەسی مورتەد هەرچی تێکدا بێت پێش موسڵمان بوونی بێ یان دوای موسڵمان بوونی ، دەبێ بیبژێرێ.

**یانزەهەم: تاوان کردن بەرامبەر مورتەد :**

_ئەگەر موسڵمانێك تاوان بکات بەرامبەر مورتەدێك ئەوا تۆڵەی لێ ناکرێتەوە بەڵکو تەنها تەمێ دەکرێ.

_ئەگەر مورتەد تومەت دروست بکات بۆ کەسێك حەدی لێ نادرێ وە وتراویشە حەدی لێ دەدرێ ئەگەر مافی کەسێکی تر بێت.

_ئەگەر مورتەدێك کوژرا ئەوا خوێنەکەی بەهەدەر دراوە و بۆهیچ کەسێك نیە لە بنەماڵەکەی داوای تۆڵەکردنەوە یان خوێنەکەی بکات.

_هەرکەسێك ماڵی مورتەدێك بفەوتێنێ ئەبێ بیبژێرێ ئەگەر بەیتولمالی موسڵمانان هەبوو چونکە بیت المال دەبێتە خاوەنی.

**دوانزەهەم : تەمێ کردنی مورتەد کاتێك تەوبە دەکات و موسڵمان دەبێ.**

بەڵێ دروستە تەمێ کردنی مورتەد کاتێ دەبێتە موسڵمان وەك سزایەك لەپای مورتەد بوونی و تاکو ببێتە هۆیەك بۆ گێرانەوەی غەیری خۆی.

**سایزدەهەم : ئەگەر مورتەدێك موسڵمان بوو و گەڕایەوە بۆ دینەکەی ئایا داوای لێ دەکرێ حەجەکەی بگێڕێتەوە یاخود نا :**

پێشینی ئومەت دوو قەولیان هەیە باشتر وایە بیگێڕێتەوە.

**چواردەهەم:** بە کەنیزە کردنی خێزانی مورتەد و منداڵەکانی :

ئەم بابەتە جێگای بۆچوونی ووتەی جیاوازە لەنیوان شەرعناسان پاش کەمێکی تر باسی دەکەین.

**پانزەهەم : کەسی مورتەد ناکرێتە کۆیلە و فیدیە و سەرانە لێ وەرناگیرێت، بەڵکو دەکوژرێت یان دەبێتە موسڵمان وەك کەسانی بتپەرست ﴿ تُقَتِلُونَهُم أو يُسلِمُونَ ﴾**

## پرسی بیست و حەوتەم: پێکەوە بەستن نیە لەنێوان کوشتن و کافر کردن :

هەموو ئەوەی دەکوژرێ کافر نیە وەك پیاو کوژ یان چەتە.

وە هەندێك جار حەرامیش دەبێت کوشتنی کافر ئەگەر خاوەن پەیمان ذیمی بێت.

## پرسی بیست و هەشتەم: هەڵگەڕانەوەی شێت:

شێت مورتەد بوونی لی ناوەشێتەوە بەڵکو ئەگەر کوفریش بکات لێی ناگیرێ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( رفع القلم عن الثلاث عن المجنون حتى يبلغ و عن الطفل حتى يبلغ...) منال و شێت ئەگەر کوفری لێ بدی کرا لێ ناگیرێ سزا نادرێ لەسەری چونك خاوەنی ئەهلیەت نین کە بریتیە لە عەقڵ باڵغ بوون.

## پرسی بیست و نۆهەم : شێت بوونی مورتەد :

ئەگەر مورتەد شێت بوو دوای هەڵگەڕانەوەکەی ئەوا حوکمی مورتەد بوون و کافربوونی لەسەر لاناچێت.

## پرسی سی : حوکمی ئافرەتی هەڵگەڕاوە (المرتدة):

ئافرەتیش هاوشێوەی پیاو دەکوژرێت بەپێی گشتی بوونی فەرمایشتەکەی پێغەمبەرﷺ : ( من بدل دينه فاقتلوه ).

بەڵام نەهی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەکوشتنی ئافرەتان ئەوە تایبەتە بە کافری بنەڕەتی.

بەڵگە لە واجب بوونی کوشتنی ئەوەیە کە بەیهەقی دار القطنی هێناویەتی ئەفەرمێ : ئەبو بەکر داوای تەوبەی لە ئافرەتێك کرد ناوی دایکی قورفە بوو و هەڵگەرابوەوە لە ئیسلام دواجار سور بوو لەسەر تەوبە نەکردن و کوشتی.

لەهەمان کاتتدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی دوو کچ لە کاتی فەتحی مەککە بەتاوانی شیعر ووتنیان دژی ئیسلام و موسڵمانان.

وە ئیمامی ئەحمەد لە ئەحکامی ئەهلی ملل ی خەلال فەرموویەتی : ( إذا ارتدت أستتيبت فإن تابت و إلا قتلت، ومن الناس من يحتج بنهي النبي ﷺ عن قتل النساء وذاك غير ذا ليس هو في ذا في شيء ).

واتە : ئەگەر ئافرەت هەلگەرایەوە داوای تەوبەی لێ دەکرێ ئەگەر نا دەکوژرێ، هەیە لەخەڵکی بەڵگە بەنەهی کردنی پێغەمبەرﷺ دێنێتەوە لە کوشتنی ژنان وە ئەوەش جیاوازە بەباسەکەی ئێمە بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی پێوەی نیە.

ابن قدامة لە موغنی دەفەرمێت : ( أما نهي النبي ﷺ عن قتل المرأة فالمراد بها الأصلية ).

واتە : نەهی کردنی پێغەمبەر ﷺ لە کوشتنی ژنان ئەوە سەبارەت بە کافیرەی بنەڕەتیە.

ووتەی پەسەند و ڕاست ئەوەیە ئافرەتانی هەڵگەڕاوەکان ناکرێت بە کەنیزە تەنها ئەوانە نەبێت کە لە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵێکی جەنگاوەری بەرهەڵستیکاردان، ئەوانە دەگیرین وەکو کەنیزەك و ناکوژرێن، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان حوکمی موڕتەدێکی دیاریکراو لەگەل وڵاتێك یان کۆمەڵێکی موڕتەدی بەرهەڵستیکاری خاوەن هێز و دەسەڵات لە بەکەنیزەك گرتنی ژن و منداڵەکانیان و داوا نەکردنی تەوبە لێیان (الاستتابة) ئەمەش فەرموودەی زایانە لەوبارەیەوە :

أبو يوسف لە کتێبی" الخراج "لاپەڕە ٦٧ ،بەشی الحكم المرتدين إذا حاربوا ومنعوا الدار ، ئەفەرمێ : ( ولو أن المرْتدين منعوا الدار وحاربوا سُبِيَ نِسَاؤُهُمْ وَذَرَارِيهِم وَأُجْبِرُوا عَلَى الإِسْلامِ كَمَا سَبَى أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ذَرَارِيَّ مَنِ ارْتَدَّ مِنَ الْعَرَبِ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ وَغَيْرِهِمْ.كَمَا سبى عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ كَرَّمَ الله وَجه بني نَاجِية مُوَافَقَةً لأَبِي بَكْرٍ وَلا يُوضَعُ عَلَيْهِمُ الْخَرَاجُ.وَإِنْ أَسْلَمُوا قَبْلَ الْقِتَالِ وَقَبْلَ أَنْ يُظْهَرَ عَلَيْهِمْ حَقَنُوا دِمَاءَهُم وَأَمْوَالَهُم وَامْتَنَعُوا مِنَ السِّبَاءِ.وَإِنْ ظُهِرَ عَلَيْهِمْ؛ فَأَسْلَمُوا حَقَنُوا الدِّمَاءَ وَمَضَى فِيهِمْ حُكْمُ السِّبَاءِ عَلَى الصِّبْيَانِ وَالنِّسَاءِ؛ فَأَمَّا الرِّجَالُ فَأَحْرَارٌ لَا يُسْتَرَقُّونَ... وَلَيْسَ عَلَى الرِّجَالِ مِنْ أَهْلِ الرِّدَّةِ وَلا مِنْ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ سَبْيٌ وَلا جِزْيَةٌ إِنَّمَا هُوَ الْقَتْلُ أَوِ الإِسْلامُ، وَكُلُّ مَنْ كَانَ عَلَيْهِ الْقَتْلُ أَوِ الإِسْلامُ فَظَهَرَ الإِمَامُ عَلَى دَارِهِمْ سبى الذَّرَارِيَّ، وَقَتَلَ الرِّجَالَ وَقُسِمَت الْغَنِيمَةُ عَلَى مَوَاضِعِ قِسْمَةِ الْخُمُسِ لِمَنْ سمى اللَّهُ فِي كِتَابِهِ وَأَرْبَعَةُ أَخْمَاسِهِ لِمَنْ شَهِدَ الْوَقْعَةَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؛ فَهَذَا جَائِزٌ.وَإِنْ تَرَكَ الإِمَامُ السِّبَاءَ وَأَطْلَقَهُمْ وَعَفَا عَنْهُمْ وَتَرَكَ الأَرْضَ وَأَمْوَالَهِمْ فَهُوَ فِي سَعَةٍ...)

واتە : ئەگەر هەڵگەڕاوەکان ڕێگری بکەن ولاتەکەیان ملکەچ بێت بۆ حوکمی الله و لەوپێناوەشدا بجەنگن ئەوا ژن و منداڵەکانیان بە کەنیزەك دەگیرێت، و ناچار دەکرێن لەسەر موسڵمان بوون، هەر وەك ئەبو بەکر رضي الله عنه ژن و منداڵی عەرەبە هەڵگەڕاوەکانی لە بەنی حەنیفە و غەیری ئەوانی کردە کەنیزەك و سەبایا، هەروەها دوای ئەو عەلی کوری ئەبو تالیب رضي الله عنه لەسەر شوێن پێی ئەبو بەکر ژن و منداڵەکانی موڕتەدانی بەنی ناجیەی بەکەنیزە و سەبی گرت ، وە خەراجیان لەسەر دانانرێ، ئەگەر موسڵمان بن پێش شەڕ کردن و زاڵ بوون بەسەریان ئەوا خوێن و ماڵیان دەپارێزن و ناکرێنە کەنیزەك و سەبایا، بەڵام کاتێ زاڵ بوون بەسەریان بوونە موسڵمان ئەوا خوێنیان دەپارێزرێت بەلام حوکمی سەبایا و

کەنیزە هەر دەمێنێ بەسەر ژن و منداڵەکانیان ، بەڵام پیاوەکانیان[1] ئازادن و نابنە کۆیلە وە پیاوانی هەڵگەڕاوە و بتپەرستەکان حوکمی کۆیلە کردن و سەرانەدانیان لێ وەرناگیرێ، بەڵکو یان ئیسلام یان کوشتن، بۆیە هەرکەسێك حوکمی لە نێوان کوشتن و موسڵمان بون دابێت ئەوە هەرکاتێك پێشەوای موسڵمانان زاڵ بوو بەسەر وڵاتەکەیان ئەوا پیاوەکانیان دەکوژێت و ژن و منداڵەکانیان وەکو کەنیزەك و سەبایا دەگرێ ، ماڵ سامانیشیان دەبێتە دەستکەوت و غەنیمەت ، لەهەمان کاتدا پێشەوای موسڵمانان بۆی هەیە وازبێنێ لەگرتنی ژن و مندال و ماڵ و سامانیان. )

ئەبو یەعلی ئەفەرمێ : ( فإن انحازوا في دار ينفردون بها عن المسلمين حتى صاروا فيها ممتنعين، وجب قِتَالُهُمْ عَلَى الرِّدَّة ، ويقاتلون قتال أهل الحرب وَلَا يَجُوزُ أَنْ يسترق رجالهم، وتغنم أموالهمن وَتسبى ذراريهم َالذين حدثوا بعد الردة. )[2]

واتە : ئەگەر لە وڵاتێکی جیا لە موسڵمانان بن و ڕێگریش بەن لەپەیوەست بوون بەحوکمی ئیسلام ئەوا شەڕوکوشتارکردنیان دەبێتە واجب ، کوشتارکردنێك هاوشێوەی موشتارکردنی کافرە شەرخوازەکان وە دروست نیە پیاوەکانیان بکرێنە کۆیلە پاشان ماڵ و سامانیان بەغەنیمەت دەبرێ و ئەو منداڵانەشی دوای هەڵگەرانەوەیان لەدایك بوونە دەکرێنە سەبایا .

وە ابن قدامة ئەفەرمێ : ( وَمَتَى ارْتَدَّ أَهْلُ بَلَد ، وَجَرَتْ فيه أَحْكَامُهُمْ ، صَارُوا دَارَ حَرْبٍ فِي اغْتِنَامِ أَمْوَالِهِمْ ، وَسَبْيِ ذَرَارِيِّهِمْ الْحَادِثِينَ بَعْدَ الرِّدَّة ، وَعَلَى الْإِمَامِ قِتَالُهُمْ ، فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَاتَلَ أَهْلَ الرِّدَّةِ بِجَمَاعَةِ الصَّحَابَةِ ، وَلِأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ أَمَرَ بِقِتَالِ الْكُفَّارِ فِي مَوَاضِعَ مِنْ كِتَابِهِ ، وَهَؤُلَاءِ أَحَقُّهُمْ بِالْقِتَالِ؛لِأَنَّ تَرْكَهُمْ رُبَّمَا أَغْرَى أَمْثَالَهُمْ بِالتَّشَبُّهِ بِهِمْ وَالِارْتِدَادِ مَعَهُمْ ، فَيَكْثُرُ الضَّرَرُ بِهِمْ .وَإِذَا قَاتَلَهُمْ ، قَتَلَ مَنْ قَدَرَ عَلَيْهِ ، وَيَتْبَعُ مُدْبِرَهُمْ ، وَيُجْهَزُ عَلَى جَرِيحِهِمْ ، وَتُغْنَمُ أَمْوَالُهُمْ .وَبِهَذَا قَالَ الشَّافِعِيُّ . )[3]
واتە : هەرکاتێك خەڵکی وڵاتێك هەڵگەڕانەوە و حوکمی خۆیان بەسەر خۆیاندا جێبەجێ کرد ئەوا وڵاتەکەیان ئەبێتە وڵاتی شەڕ لە بەغەنیمەت بردنی ماڵ و سامانیان وە ئەو منداڵانەشی کە لەدوای هەڵگەرانەوەیان بوونە دەکرێنە سەبایا ، واجبە لەسەر ئیمام کوشتاریان بکات چونکە ئەبو بەکر ڕەزای خوا لێ بێت، بە کۆمەڵێ لە صەحابە کوشتاری هەڵگەراوەکانی کرد وە لەبەرئەوەشی خوای گەورە لەچەندین شوێنی کیتابەکەی فەرمانی کردوە بە کوشتاری کافران، ئەمانەش لە پێشترن بە جەنگانیان چونکە وازلێ هێنانیان هۆکارە بۆ ئەوەی هاوشێوەکانیان هەمان کاری ئەوان دوبارە بکەنەوە و هەڵبگەرێنەوە، ئەو کات زەرەری زۆر بەهۆیان دەکەوێتەوە هەروەها کاتێك کوشتاریان کرا هەرکەسێکیان

[1] ئەو پیاوانەی کە جەنگاوەرنین ، چونکە جەنگاوەرەکانیان موڕتەدی (مغلظة)ن تەوبەیان لێ وەرناگیرێ کە بەدیل بگیرێن بەڵکو دەکوژرێن.
[2] الأحكام السلطانية (ص ٤٢)
[3] المغني (٩٠/١٠)

کەوتە بەردەست دەکوژرێ و شوێنی ڕاکردوەکانیان دەکەوترێ و بریندارەکانیان دەکوژرێ و ماڵ و سامانیشیان غەنیمەتە و دەبرێ ، هەر بەمەش فەرموویەتی شافیعی.

ئیبن تەیمیە فەرموویەتی : ( النصيرية مرتدون ومن أسوء الناس ردة تقتل مقاتلتهم ، و تغنم أموالهم ، سبي الذرية فيه نزاع و أكثر العلماء على السبي هذا دلت عليه سيرة الصديق في قتال المرتدين .)[1]
واتە : نوسەیریەکان هەڵگەڕاوەن وە لەخراپترینی هەڵگەڕاوەکانن ، جەنگاوەرەکانیان دەکوژرێت ، ماڵ و سامانیان بە غەنیمەت دەبرێت ، بردنی منداڵەکانیان بەسەبایا ڕجیایی تێدایە و زۆربەی زانایان لەگەل ئەوەن کە دەکرێنە سەبی ئەمەش بەڵگەی کاری ئەبو بەکری صدیقە رضي الله عنه بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان.

وە دەفەرمێت : ( تسبي نساؤهم فإنهم زنادقة مرتدون ، لاتقبل توبتهم بل يقتلون أينما ثقفوا )[2]
واتە: ژنەکانیان دبرێن بەکەنیزەك چونکە ئەوانە زەندیقی هەڵگەڕاوەن ، پیاوەکانیشیان تەوبەیان لێ وەرناگیرێ لەهەرکوێ بگیرێن دەکوژرێن.

منیش ئەڵێم : ئەمە راست و پەسەندە چونکە هاوەڵە بەرێزەکان جیاوازیان نەدەکرد لەنێوان منداڵەکانیان کە دەبران بە سەبایا ئایا پێش یان دوای هەڵگەرانەوەیان لەدایك بوونە.

بۆیە ئەصڵ لە بردن و بە کەنیزەك گرتنی ژنانی موڕتەدان کاری ئەبو بەکری صدیقە نەك عیبرەت بەوەی گومانی پێچەوانەی ئەو ببرێت.

هەروەك چۆن عەلی ژنانی موڕتەدانی بەنی ناجیەیەی بەکەنیزەك گرت ، بەیهەقی إبن أبي شەیبە هێناوێتی.

وە ئەو وتەیەی ئیبن و قودامە پەسەند نیە کە فەرموویەتی : ( الرق لايجري على المرتد رجلا كان أو امرأة وسواء لحق بدار الحرب أو أقام بدار الإسلام ، وقال أبو حنيفة إذا لحقت المرتدة بدار الحرب جاز استرقاقها لأن أبا بكر سبي بني حنيفة واسترق نساءهم .
ولنا قول النبي صلى الله عليه وسلم : ( من بدل دينه فاقتلوه ) ولأنه لايجوز إقراره على كفره فلم يجز إسترقاقه كالرجل ، ولم يثبت أن الذين سباهم أبو بكر كانوا أسلموا ولا ثبت لهم حكم الردة ، فإن قيل قد روي عن علي أن المرتدة تسبي ، قلنا هذا الحديث ضعيف ضعفه أحمد )[3]

[1] مجموع الفتاوى (٥٥٣/٢٨)
[2] مجموع الفتاوى (٦٢/٣٥)
[3] المغني (٨٩/١٠)

لێرەدا ووتەکانی ئین و قودامە بەهەند وەرناگیرێ چونکە هەموو ووتەکانی جێگای پەسەند کردن نیە، وەك پێشتر باسمان کرد جیاوازی هەیە لەنێوان ژنێکی مورتەدی دیاریکراو لەگەل ژنانی کۆمەڵانێکی هەلگەراوەی بەهەڵستی کاری جەنگاوەر، وە ئەو قەولەی کە داوێتیە پاڵ ئەبو حەنیفە ئەو قەولی پەسەندە و کاری صەحابەی لەسەرە.

ئەما ئەم قەولەی ئیبن القیم کە فەرموویەتی : ( أن خلاف عمر لأبي بكر أشهر من أن يذكر كخلافه في سبي اهل الردة فسباهم أبو بكر وخالفه عمر و بلغ خلافه الى أن ردهن حرائر الى أهلهن ، إلا من ولدت لسيدها منهن ، ونقض حكمه من جملتهن خولة بنت إياس الحنفية أم محمد بن علي )[1]

واتە : جیاوازی ئەبو بەکر لە عومەر ئاشکراترە لەوەی باسبکرێ وەك ڕاجیا بوونی لە بەسەبایا کردنی ژن و منداڵی هەلگەڕاوەکان کە ئەبو بەکر کردنیە سەبایا و عومەر پێچەوانەی بوو تا سەرەنجام عومەر گەڕاندنیەوە بۆ کەسوکارەکانیان و ئازادی کردن تەنها ئەو کەسانەیان نەبێـت منداڵی بوبێـ لە خاوەنەکەی ، وە حوکمەکەشیان هەلوەشاندەوە کە لەنێویاندا خەولەی کچی ئیاسی حەنەفی هەبوو ناسراو بە دایکی محمدی کوری عەلی.

ئەمەش لەسەر بۆچوونی هەندێك لەو زانایانەی کە دەڵێن هاوەڵان جیاوازیان بوە سەبارەت بە حوکمی ژنانی هەڵگەڕاوەکان ، بەلام ڕاستتر ئەوەیە هاوەڵان کۆك بوونە لەسەر دروستێتی ئەو کارە و ئەبو بەکر بەتەنها هەڵنەستاوە بەو کارە ئەوەتا عەلی یش هەمان حوکمی داوە بەسەر ژنانی هەلگەڕاوەکانی بەنی ناجیە ،بەڵام عومەر کە سەبایەکانی دایەوە بە کەسوکاریان ئەوە مانای ئەوە نیە عومەر بە دروستی نەزانیبێ هەر وەك (شێخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە) ئەفەرمێت : ( ولكن من الناس من يقول سبا أبو بكر نساءهم وذراريهم ، وعمر أعاد ذلك عليهم ، وهذا إذا وقع ليس فيه بيان إختلافهما ، فإنه قد يكون عمر كان موافقا على جواز سبيهم ، لكن رد عليهم سبيهم ، كما رد النبي ﷺ على هوازن سبيهم بعد أن قسمه بين المسلمين )[2]

واتە : هەیە لەخەڵکی دەلێت ئەبو بەکر ژن و منداڵەکانیانی کردە سەبی و عومەریش گێڕایەوە بۆیان ، ئەمە ئەگەر ڕووی دابێت مانای ئەوە نادات جیاواز بوبێتن و چونکە ئەشێت عومەر کۆك بوبێت سەبارەت بە سەبی کردنیان بەلام گەراندیەوە بۆیان وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ سەبایەکانی هەوازنی گەڕاندەوە بۆیان دوای ئەوەی دابەشی کردبوو بەسەر موسڵماناندا .

کەواتە دروستە بۆ وەلی ئەمری موسڵمانان سەرپشك بێـت لەو نێوەندەدا ئەگەر بەرژوەندیەك هەبوو.

---

[1] إعلام الموقعين (١٦٥/٢)
[2] منهاج السنة (٣٤٩/٦)

## پرسی سی و دوو : هەڵگەڕانەوەی دەسەڵاتدار ( ردة الحاكم ) :

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی موسلیم ئەفەرمێت قاضی عیاض فەرموویەتی : (أجمع العلماء على أن الإمامة لاتعقد لكافر وعلى أنه لو طرأ عليه كفر انعزل ، وقال : فلو طرأ عليه الكفر ، خرج عن حكم الولاية وسقطت طاعته ووجب على المسلمين القيام عليه ، وخلعه ونصب إمام عادل فإن لم يقع الا لطائفة وجب عليهم القيام بخلع الكافر ، فإن تحققوا العجز لم يجب القيام وليهاجر المسلم عن أرضه إلى غيرها ويفر بدينه )

واتە : كۆدەنگن زانایان سەبارەت بەوەی پێشەوایەتی دانامەزرێ بۆ کافر، هەربۆیە ئەگەر کوفری کەوتە سەر لا ئەبرێت وە فەرموویەتی: ئەگەر کوفری کەوتە سەر، ئەوا دەردەچێت حوکمی دەسەڵاتداربوونی وە گوێرایەڵی کردنی نامێنێ و دەبێتە واجب لەسەر موسڵمانان هەڵسان لەسەری و دانانی موسڵمانێکی دادپەروەر لە شوێنەکەی، جا ئەگەر نەکرا تەنها بەدەستەیەك نەبێت لە موسڵمانان ئەوا لادانی کافرەکە واجب دەبێـت لەسەرئەوان ، ئەگەر یش دڵنیا بوون لە بێ تواناییان ئەوا هەڵسان واجب نابێت بەڵکو با موسڵمانان کۆچ بکەن و خاکەکەیان بەجێبهێڵن بۆ شوێنێکی تر، لە پێناو دینەکەیان.

ابن حەجەر فەرموویەتی : ( ومن عجز وجبت عليه الهـــجرة )[1]

واتە : هەرکەسێك توانای نەبوو واجب دەبێت لەسەری کۆچکردن .

صديق خان فەرموویەتی : ( إذا كفر الخليفة حل قتاله بل وجب ، لأنه فاتت مصلحة نصبه ، بل يخاف مفسدته على القوم فصار قتاله من الجهاد )[2]

واتە : ئەگەر خەلیفە کوفری کرد حەڵاڵ ئەبێـت کوشتارکردنی ، بەڵکو واجب یش دەبێـت ، لەبەر ئەوەی بەرژوەندی لە دانانی نامێنی ترس دەکرێ لە خراپەکانی بەرامبەر گەلەکەی هەر بۆیە کوشتار کردنی بەشێکە لە جیهاد .

ئەحمەدی کوڕی نەصری خوزاعی خروجی کرد لەسەر مەئمون کاتێك هەڵگەڕایەوە و بوو بە جەهمی ، هەر لەسەر ئەوە ئیمام ئەحمەد مەدح و ستایشی کرد و پێی فەرموو : ( رحمه الله ما أسخاه لقد جاد بنفسه له )[3] .

واتە : ڕەحمەتی خوای لێ بێ چەندە بەخشەر بوو لەو پێناوەدا گیانی بەخشی .

---

[1] فتح البارى ( ١٢٣/١٣)

[2] الإمامة (ص ١٢٤)

[3] إبن كثير (٣٠٣/١٠)

هەر بۆیە هەڵگەڕانەوەی دەسەڵاتدار هەلگەڕانەوەی سەرباز و دەستوپەیوەندەکانێتی چونکە ئەوانە سەری دەخەن هۆکاری مانەوەین جگە لە خەلکەکەی مەگەر ڕازی بوبن بە کوفرەکەی، وە لەحەقیاندا بە مەرج نەگیراوە ئیقامە حوجە لەبەر ئەوەی بونەتە بەرهەڵستیکار بەهێز و دەسەڵاتی سەرۆکەکەیان ، بەرهەڵستیکار بەهێز ، یان چوونە نێو وڵاتی کافری شەڕ کەر لەگەل موسڵمانان واتە حوکمی ئەو کەسانەیان نامێنێ کە(المقدور علیه ) ن واتە ؛ لە ولاتی ئیسلام و لەژێر سایەی حوکمی شەرعن، هەرکانێك پێویست بکات دادگایی بکرێن ، هەر بۆیە سەربازانی تاغووتان حوکمی سەرۆکەکانیان هەیە لە کوفر لە خراپەیان چونکە هۆکارن بۆ مانەوەی حوکم و دەسەڵاتی کافر هەر ئەوانن یارمەتی ئەدەن سەری دەخەن لە جەنگانی دژی دین .

خوای گەورەش هەمان مامەڵەی لەگەل سەربازەکانی فیرعەون کرد بەوەی هەردوکیانی پێکەوە لەناو برد و بەهەمان سزا .

صەحابە بەڕێزەکانیش هەمان مامەڵەیان دەکرد لەگەل مورتەدان و سەربازەکانیان و هەرکەسێك پەیوەندی هەبوایە پێیان.

## پرسی سی و سێ : حوکمی ئەو مورتەدەی خاوەن هێز و کۆمەڵێکی مل نەدەرە بۆ شەرعی الله (الطائفة الممتنعة )[١] :

جیاوازی دەکرێ لەنێوان مورتەدێکی دیاری کراو لەگەڵ مورتەدێکی خاوەن هێز و مل نەدەر بە کۆمەلێك یان وڵاتێکی خاوەن هێز و دەسەلات لەسەبایا لێ گرتنیان و داوا نەکردنی تەوبە لێیان ئەمەش فەرموودەی ئەهلی عیلمە لەو بارەیەوە :

أبو يوسف لە کتێبی" الخراج "لاپەڕە ٦٧ ،بەشی الحكم المرتدين إذا حاربوا ومنعوا الدار ، ئەفەرمێ :

( وَلَوْ أَنَّ الْمُرْتَدِّينَ مَنَعُوا الدَّارَ وَحَارَبُوا سُبِيَ نِسَاؤُهُمْ وَذَرَارِيهِمْ وَأُجْبِرُوا عَلَى الإِسْلامِ كَمَا سَبَى أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ذَرَارِيَّ مَنِ ارْتَدَّ مِنَ الْعَرَبِ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ وَغَيْرِهِمْ.كَمَا سبى عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ كَرَّمَ الله وَجه بني نَاجِيةِ مُوَافَقَةً لأَبِي بَكْرٍ وَلا يُوضَعُ عَلَيْهِمُ الْخَرَاجِ.وَإِنْ أَسْلَمُوا قَبْلَ الْقِتَالِ وَقَبْلَ أَنْ يُظْهَرَ عَلَيْهِمْ حَقَنُوا دماءَهُم وَأَموَالَهُم وَامْتَنَعُوا مِنَ السِّباء.وَإِنْ ظُهِر عَلَيْهِمْ؛ فَأَسْلَمُوا حَقَنُوا الدِّمَاءَ وَمَضَى فِيهِمْ حُكْمُ السِّبَاءِ عَلَى الصِّبْيَانِ وَالنِّسَاءِ؛ فَأَمَّا الرِّجَالُ فَأَحْرارٌ لَا يُسْتَرَقُّونَ...)

واتە : ئەگەر هەڵگەڕاوەکان ڕێگری بکەن ولاتەکەیان ملکەچ بێت بۆ حوکمی ئیسلام و لەوپێناوەشدا بجەنگن ئەوا ژن و منداڵەکانیان بە کەنیزەك دەگیرێت، و ناچار دەکرێن

[١] الطائفة الممتنعة : بریتیە لە هەموو ئەو کۆمەڵ و تاقم و دەوڵەتانەی ڕێگری ئەکەن لە پەیوەست بوونیان بە حوکمی ئیسلام بەهۆی ئەو سەرباز و هێز و دەسەلاتەی کە هەیانە ، تەنانەت ئەگەر تاکە حوکمێکی ئیسلامیش بێت ، بۆیە پێی ئەڵێن کۆمەڵی بەر هەلستیکار یان کۆمەڵی مل نەدەر بۆ شەرعی الله ، یان کۆمەڵێ ڕێگر لە حوکمی ئیسلام ئەم ناوانە هەمووی نزیك کراوەی یەکترن.

لەسەر موسڵمان بوون، هەر وەك ئەبو بەکر ﵁ ژن و منداڵی عەرەبە هەڵگەڕاوەکانی لە بەنی حەنیفە و غەیری ئەوانی کردە کەنیزەك و سەبایا، هەروەها دوای ئەو عەلی کوری ئەبو تالیب ﵁ لەسەر شوێن پێی ئەبو بەکر ژن و منداڵەکانی مورتەدانی بەنی ناجیەی بەکەنیزە و سەبی گرت ، خەراجیان لەسەر دانانرێ، ئەگەر موسڵمان بن پێش شەڕ کردن و زاڵ بوون بەسەریان ئەو اخوێن و ماڵیان دەپارێزن و ناکرێنە کەنیزەك و سەبایا، بەڵام کاتێ زاڵ بوون بەسەریان بوونە موسڵمان ئەو اخوێنیان دەپارێزرێت بەلام حوکمی سەبایا و کەنیزە هەر دەمێنێ بەسەر ژن و منداڵەکانیان.

ئەبو یەعلی ئەفەرمێ : ( فإن انحازوا في دار ينفردون بها عن المسلمين حتى صاروا فيها ممتنعين، وجب قِتَالُهُمْ عَلَى الرِّدَّة ، ويقاتلون قتال أهل الحرب وَلَا يَجُوزُ أَنْ يسترق رجالهم، وتغنم أموالهمن وَتسبى ذراريهم َالذين حدثوا بعد الردة. )[1]

واتە : ئەگەر لە وڵاتێك بوون جیا لە موسڵمانان بەجۆرێك بەهەڵستی بکەن لە ملکەچ بوون بۆ حوکمی ئیسلام کوشتارکردنیان دەبێتە واجب ، کوشتار دەکرێن وەك کوشتار جەنگاوەران، وە دروست نیە پیاوەکانیان بکرێنە کۆیلە پاشان ماڵ و سامانیان بەغەنیمەت دەبرێ و ئەو منداڵانەشی دوای هەڵگەرانەوەیان لەدایك بوونە دەکرێنە سەبایا .

وە ابن قدامة ئەفەرمێ : ( وَمَتَى ارْتَدَّ أَهْلُ بَلَد ، وَجَرَتْ فيه أَحْكَامُهُمْ ، صَارُوا دَارَ حَرْبٍ في اغْتِنَام أَمْوَالِهِمْ ، وَسَبْيِ ذَرَارِيِّهِمْ الْحَادِثِينَ بَعْدَ الرِّدَّة ، وَعَلَى الْإِمَامِ قِتَالُهُمْ )[2]

واتە : هەرکاتێك خەڵکی وڵاتێك هەلگەڕانەوە و حوکمی خۆیان بەسەر خۆیاندا جێبەجێ کرد ئەوا وڵاتەکەیان ئەبێتە وڵاتی شەڕ لە بەغەنیمەت بردنی ماڵ و سامانیان وە ئەو منداڵانەشی کە لەدوای هەلگەرانەوەیان بوونە دەکرێنە سەبایا ، واجبە لەسەر ئیمام کوشتاریان بکات.

وە هەر لەم بارەیەوە نامیلکەیەکمان نوسیوە بەناونیشانی ( حقيقة الطائفة الممتنعة و أحكامها وبيان كفرها ووجوب قتالها ) .

[1] الأحكام السلطانية ( ص: ٥٢).
[2] المغني (٩٠/١٠).

## پرسی سی وچوار: حەقیقەتی(استتابة )سەبارەت بەکەسێک کەوتبێتە کوفرەوە واجب بوونی:

پێناسەی ( استتابة ) : بریتیە لە داوا کردنی تەوبە لەو کەسەی کەوتۆتە کوفرەوە ، وە بۆی ڕوون دەکرێتەوە کە دەکوژرێت ئەگەر تەوبە نەکات.

### حوکمی ئەم داواکردنە :

زانایان ڕاجیان دەربارەی حوکمی ( إستـتابە ) :

جەماوەری زانایان بە واجبی دەزانن داوای تەوبە بکرێ لە مورتەد پاشان ئەگەر تەوبەی نەکرد بکوژرێ.

بەلام کۆمەڵێکی تری زانایان فەرموویانە : سـونــەتــە .

عومەر ﵁ سەرزەنشتی ئەبو موسای ئەشعەری کرد کاتێ مورتەدێکی کوشت بوو بەبێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکات.

پێی فەرموو ئیمامی عومەر ﵁ : ( هلا حبستموه ثلاثا ، وأطعمتموه كل يوم رغيفا ، واستتبتموه لعله يتوب )[1]

واتە : ئەوە بۆ زیندانیتان نەکرد سێ ڕۆژ و هەموو ڕۆژێك نانێکتان بدایە پێی و داوای تەوبە کردنتان لێ بکردایە بەڵکو تەوبەی بکردایە .

وە عەبدوڵای کوڕی مەسعود داوای تەوبەی لە قەومێك کرد کاتێك هەڵگەڕابونەوە . رواه أحمد

هەروەها داواکردنی تەوبە چەسپاوە لە عەلی و عوسمان و موعاز و غەیری ئەوانیش لە صەحابە.

بەڵگەش هێنراوەتەوە بەم ئایەتەی خوای گەورە : ﴿ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡ ﴾(التوبة :٥)

[1] رواه مالك و عبدالرزاق والبيهقي.

(ئیمامی نەوەوی) فەرموویەتی لە شەرحی موسلیم : ( وقد أجمعوا على قتل المرتد واختلفوا في استتابته هل هي واجبة أو مستحبة ، وفي قدرها وفي قبول توبته ).

واتە : زانایان کۆدەنگن لەسەر کوشتنی موڕتەد بەڵام ڕاجیان سەبارەت بەدوا کردنی تەوبە ئایا واجبە یان سونەتە وەتا چ ئاستێکە وە وەرگرتنی .

## پرسی سی و پێنج : ئەو موڕتەدەی دەکوژرێت بەبێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکرێ :

ناسینی ئەم جۆرە هەموو ئەو هەڵگەڕاوانە دەگرێتەوە کە  توند و سەخت (مغلظة )یە.

نموونەی : جنێودان بەخوا و پێغەمبەر و  پشتیوانی کردنی کافران و زەندیق و فاڵـچی .

ئەم جۆر کوفرانە هاوشێوەکانی وا لە خاوەنەکەی دەکات بکوژرێت بەبێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکرێ.

بەڵگەش بۆئەمە کاری پێغەمبەرە ﷺ لەگەل ئەوانەی هەڵگەڕانەوە لە عەڕەنیەکان و کاری هاوەڵەکانێتی کە کوشتیانن بەبێ ئەوەی دوای تەوبەیان لێ بکەن و بەبێ ئەوەی کەسیش نارەزایەتی دەرببڕێ لەبەر ئەوەی ئەیانزانی ڕیدەکانیان (مغلظة) یە.

ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی : ( الزنديق لا يستتاب ) احكام أهل الملل للخلال ٤٥٩.

واتە : زەندیق داوای تەوبە کردنی لێ ناکرێ .

ئیبن و تەیمیەش ئەفەرمێ : ( ويفرق في المرتد بين الردة المجردة فيقتل إلا ان يتوب ، وبين الردة المغلظة ، فيقتل بلا إستتابة )[1]

واتە : جیاوازی دەکرێ لەنێوان ڕیدەی مجردة کە دوای ئەوەی تەوبەی نەکرد دەکوژرێ ، لەگەل ڕیدەی مغلظة کە بەبێ ئەوەی دوای تەوبەی لێ بکرێ دەکوژرێ .

[1] مجموع الفتاوى والصارم ( ١٠٣/٢٠ )

## پرسی سی وشەش: جۆری ئەو هەڵوەشێنەرەوانەی کە پێویست بە(إقامة الحجة )و داواکردنی تەوبەدەکات:

**یەکەم :** ئەو هەڵوەشێنەرەوانەی کە ڕاستەوخۆ ئەنجامدرەکەی دەکوژرێ بەبێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکرێـت :

وەك جنێودانە خوا و پێغەمبەر و پشتیوانیکەر لە کافران و فاڵچی و هەموو ئەو کوفرانەی کە ڕیدەی (مغلظة)ن پێش ئەوەی ئەنجام دەرەکەی خۆی بدات بەدەستەوە و تەوبە بکات ، دەستگیر بکرێت.

**دووەم :** ئەو هەڵوەشێنەرەوانەی (إقامة حجة) تێدانیە نیە لە کافرکردنیان بەلام خاوەنەکەی ناکوژرێت تاکو داوای تەوبەی لێ نەکرێ ؛ وەك هاوبەش دانان بۆ خوا و خوا نەناسین.

**سێیەم :** ئەو هەڵوەشێنەرەوە و کوفرانەی پیویستیان بە ( إقامة الحجة) هەیە لە کافر کردن و کوشتن ؛ وەك نکۆڵی کردن لەهەندێك سیفاتی خوای گەورە یان نکۆڵی کردن لەهەندێك جۆری فریشتە و نکۆڵی کردن لە حەرام بوونی هەندێك لە قەدەغەکراوەکان.

## پرسی سی وحەوت: ئایا کافر کردن یان مورتەد بوون پێش داواکردنی تەوبەیە یان دوای :

**یەکەم:** داوا کردنی تەوبە کاتێك پەیوەست بێت بە کوشتنەوە : ئەم داواکردنە دوای ئەوەی کافر دەکرێت و بە مورتەد دەزانرێ ئەوجا داوای لێ دەکرێ.

ئەو مورتەدەی کەوتبێتە کوفرێکی ئاشکراوە راستەوخۆ کافر دەبێت پاشان داوای تەوبەی لێ دەکرێت  ئەمەش بابەتی هاوبەش دانان (الشرك)و عیبادەت ئەنجام دان بۆ غەیری الله دەگرێتەوە.

عبدالله أبا بطين موفتی ولاتی نەجد سەبارەت بە مەزهەبی زانایان لەبارەی مورتەد ئەفەرمێ : ( فمن ارتد عن الإسلام قتل بعد الإستتابة ، فحكموا بردته قبل الحكم بإستتابته فالإستتابة بعد الحكم بالردة ، والاستتابة إنما تكون لمعين )[1]

[1] الدرر السنية (١٠/٤٠٢)

واتە : هەركەسێك هەڵگەڕێتەوە لە ئیسلام دوای داوا لێ كردنی تەوبە دەكوژرێت ، وە حوكمی مورتەد بوونی ئەبێت پێش ئەوەی حوكمی داواكردنی تەوبەی لێ بكرێ، داواكردنی تەوبە دوای مورتەد بونێتی و داواكردنی تەوبەش بۆ كەسی دیاری كراوە.

**دووەم :** داواكردنی تەوبە كاتێك پەیوەست بێت بە كافركردن، ئەوەش ئەوەیە سەرەتا داوای تەوبەی لێ دەكرێت پاشان ئەگەر نەگەڕایەوە كافر دەكرێت و دەكوژرێت. ئەم حاڵەتەش تایبەتە بەو كەسانەی تازە موسڵمان بوونە و نكۆڵی دەكەن لە حەرام بوونی هەندێ لە قەدەغەكراوەكان یان نكۆڵێ دەكەن لە واجبێك لە واجبەكان یان نەزانن بەهەندێ لەو كوفرانەی كە ئاشكرا و گەورە نیە جگە لە تەوحید و أصولی دین و نواقض الاسلام.

**ئبن و تەیمیە ئەفەرمێت دەربارەی ئەو كەسانەی ئیمامی عومەر ﷺ داوای تەوبەی لێ كردن كاتێك خواردنەوەی عەرەقیان حەڵاڵ كردبوو :** ( يستتابون و تقيم عليهم الحجة ، فإن أصروا كفروا حينئذ ، لايحكم بكفرهم قبل ذلك ، كما لم يحكم الصحابة بكفر قدامة بن مضعون )[1]

واتە : داوای تەوبە كردنیان لێ دەكرێ و ئیقامەی حوجە دەكرێن ، پاشان ئەگەر هەر پێداگربوون لەسەر ئەو كارەیان ئەو كاتە كافر دەبن ، پێش ئەوە حوكمی كوفر نادرێ بەسەریان هەروەك چۆن صەحابە حوكمی كوفریان نەدا بەسەر قودامەی كوڕی مەزعون .

**وە فەرموویەتی :** ( فإن من نشأ ببادية أو كان حديث عهد وفعل شيئا من المحرمات غير عالم بتحريمها لم يأثم و لم يحد وإن لم يستند في استحلاله لدليل )[2]

واتە : ئەگەر كەسێك لە چۆڵەوانی بژێت یان تازە موسڵمان بوبێت پاشان شتێك لە قەدەغەكراوەكان ئەنجام بدات و نەزان بێت بە حەرام بوونی ئەوا گوناحبار نابێت و حەدی سزادانیشی لێ نادرێ هەرچەندە پشت بەستوو نەبوبێت بەبەڵگە لەبەحەڵاڵ زانینی

**ابن فەرحون ئەفەرمێ لە تبصرة الحكام :** ( وأجمع أهل العلم أن المسلم إذا ارتد أنه يستتاب فإن تاب وإلا قتل ).

واتە : زانایان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر موسڵمان مورتەد ببێتەوە ئەوە داوای تەوبەی لێ دەكرێ ئەگەر تەوبەی نەكرد ئەكوژرێت . )

---

[1] مجموع الفتاوى (١٠ / ٦١٠)
[2] رفع الملام (ص : ٥٦ )

**سێیەم :** جۆری سێیەمی ئەو کوفرانەی ئەنجامدەرەکەی ڕاستەوخۆ کافر دبێت و دەکوژرێت بەبێ ئەوەی داوای تەوبەی لێ بکرێ وەك لە پێشوو باسمان کرد لە ریدەی مغلظة.

## حوکمی بەرپاکردنی حەدەکان وەک کوشتنی مورتەد لەلایەن تاک تاکی موسڵمانان کاتێک دەسەلاتدار لەکاریخست :

سەرەتا واجبە کافرکردنی مورتەد و مونافق کاتێ کوفریان دەرخست بەتایبەت ئەوانەی گاڵتە ئەکەن بە دین و بە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرمایشتەش واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك چونکە پەیوەندی بەتەوحیدەوە هەیە.

أما جێبەجێ کردنی حوکمی خوا بەسەریان ئەوە دوای داواکردنی تەوبە لێیان ئەنجام دەدرێ، ئەنجامدانەکەش لەلایەن ئیمام یان جێگرەکەی کە دادوەری شەرعیە بەرپا دەکرێ، بەلام ئەگەر ئیمام یان دادوەر لەکاریخست ئەوە بۆ تاك تاکی موسڵمانان ڕەوایە ئەنجامی بدەن،

وەلامی ئەو گومانەی کە دەڵێ (أن الحدود لایقیمها إلا الإمام أو نائبە ) حدودەکان تەنها لەلایەن ئیمام یان جێگرەکەی بەرپادەکرێ. **شێخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە دەربارەی ئەم شوبهەیە دەفەرمێت وەڵامەکەی لەچەن ڕوویەکەوە دەدرێتەوە :**

**یەکەم :** خاوەن بەندە بۆی هەیە حەدی شەرعی بەسەر عەبدەکەی جێ بەجێ بکات بەبەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : ( أقیموا الحدود علی ما ملکت أیمانکم ) رواه ابو داود وغیره.

واتە : حدود شەرعیەکان بەرپا بکەن لەسەر ئەو بەندە و کەنیزانەی موڵکی خۆتانن.

وە فەرموویەتی : ( إن زنت أمة أحدکم فلیجلدها ) رواه البخاری.

واتە : ئەگەر کەنیزەیەکی یەکێکیتان زینای کرد با جەڵدی بکات.

وە هیچ جیاوازیەکم نەزانیوە هەبێت لەنێوان شەرعناسان سەبارەت بەوەی خاوەن بەندە بۆی هەیە حەدە شەرعیەکان بەسەر بەندەکەی بەرپا بکات.

**دووەم :** ئەگەر کەسێکی خاوەن پەیمان جنێو بداتە پێغەمبەر ﷺ کوشتنی وەك کوشتنی کافرێکی شەرخوازی لێ دێت هەڵسان بەکوشتنی واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێ و دروستە بیکوژێ بەڵگەی ئەمەش ئەو ووتەیەی عەبدوڵای کوڕی عومەرە کە پییان ووت

فڵانە ڕاهیب جنێوی داوەتە پێغەمبەر ﷺ ئەویش ووتی ئەگەر من گوێم لێ ببوایە ئەمکوشت.

**سێیەم :** هاوشێوەی ئەم ڕووداوانە زۆر ڕوی داوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئەو مونافیقەی ڕازی نەبوو بە حوکمی پێغەمبەر ﷺ و عومەریش کوشتی و قورئان بۆ پشتڕاستکردنەوەی دابەزی ، هەروەها کچەکەی مەڕوان یش کە جنێوی دا بە پێغەمبەر ﷺ پیاوەکەی کوشتی و نازناوی سەرخەری خواو پێغەمبەرەکەی لێ نرا لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ.[1]

بڕوانە ووتەی ئیبن و تەیمیە سەبارەت بە هەڵسانی تاك تاکی موسڵمانان بە کاروباری سیاسی دەوڵەت بەپشتبەستن بەکاری هاوەڵان کەدەرەکەوێ بەتەنها تایبەت نەکراوە بە فەرمانڕاوەکان ( وإن قلتم ليست مشروعة لنا فهذه مخالفة للسنة ، ثم قولهم سياسة فهم يساسون بشريعة الإسلام ).[2]

واتە : ئەگەر بڵێن ئەمە بۆ ئێمە شەرعی نیە ، ئەوە پێچەوانەی سونەتە ، ئەگەر بشڵێن ئاخر ئەوە سیاسەتە ، ئەوە ئەوانیش بەشەریعەتی ئیسلام سیاسەت ئەکەن.

## نموونەی هەندێک لەو صەحابانەی خۆیان هەستاون بەئەنجامدانی حەدە شەرعیەکان :

کوشتنی ئەو مونافیقەی بەحوکمی پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو بەدەستی عومەر و لەسەردەمی پێغەمبەری خوا.

کوشتنی فاڵـچیەك بەئامادە بوونی وەلید بەدەستی جوندوبی کوڕی کەعبی غامیدی لە زەمەنی خیلافەتی عوسمان.

هەروەها عەبدوڵای کوڕی عومەر کە بیستی ڕاهیبێك جنیوی داوەتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر من گوێبیستی بومایە دەمکوشت ، پاشان چوون بۆیان هێنا و شمشێری لێ بەرزەوە کرد ئەویش نکۆڵی کرد[3] .

[1] صارم المسلول (ص ٥١٩)
[2] الفتاوى ( ٢٠/ ٣٩١ )
[3] رواه الخلال في أحكام أهل الملل.

وە کاتێك زانی بە بونی فاڵچیەك ووتی ئەوە جوندوب لەکوێ یە بیکوژێ چونکە پێشتر فاڵچیەکی تری کوشتبوو ، هەروەها حەفصەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی قاڵچیەکی ئافرەتی کوشت.

وە پیاوە کوێرەکە کاتێ کەنیزەکە یەهودیەکەی خۆی کوشت بەهۆی ئەوەی جنێوی دابوە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش خوێنی بە ڕۆیشتوو و هەدەر دایە قەڵەم.

وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ویستی کوشتاری خەواریج بکات موسڵمانانی بۆی هان دەدا بەبێ ئەوەی ئیزن وەربگرێ لە پێشەوای موسڵمانان[1] .

ڕووداوی لەم جۆرە زۆرە تەنها لێرەدا وەکو نموونە هێناومانەتەوە .

بەهەمان شێوە هەوڵی کوشتنی سەرانی بیدەع دراوە لەمێژوودا لە لایەن زانایانەوە :

**یەزیدی کوڕی هارون ٢٠٦ ك فەرموویەتی :** ( لقد حرضت أهل بغداد على قتل المريسي غير مرة )[2]

واتە : چەندین جار هانی خەڵکی بەغدادم داوە بۆ کوشتنی مەریسی .

**ئەبو بەکری کوڕی خەلادی باهیلی فەرموویەتی :** من لای سوفیانی کوڕی عویەینە بووم ، کاتێك بیشری مەریسی بهاتایە ئەو قسە خراپەی بکردایە ، سوفیان ئەیفەرموو بیکوژن[3] .

ئەم دەقانەی لە پێشینمانەوە بۆمان هاتوە ئەیسەلمێنی کە هەمویان بڕیاریان داوە کە موڕتەدێك ئاشکرا بێت ڕیدە و خراپەکاریەکانی ئەوە بۆ یەکە یەکەی موسڵمانان ڕەوایە و بۆیان هەیە بیکوژن کاتێك حاکم هەڵنەستا بەو ئەرکە.

---

[1] رواه إبن أبي شيبه
[2] خلق أفعال العباد للبخاري والرد على الجهمية ( ص ٤٤ )
[3] تاريخ بغداد ( ٦٥/٧ )

## بەشی وەڵامی گومانەکان سەبارەت بە کەسی هەڵگەڕاوە و کوشتنی :

**گومانی یەکەم بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتی ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ (البقرة :٢٥٦) وە ئایەتی ﴿ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾(يونس :٩٩) وە ئایەتی ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾ (الكهف :٢٩) :**

وەڵام :

**یەکەم :** ئەم ئایەتانە نەسخ بۆتەوە حوکمەکەی هەڵگیراوە بە ئایەتی فەرمانکردن بە کوشتاری کافر و موشریکەکان بەگشتی ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ ﴾(التوبة :٥) وە بەم ئایەتە ﴿تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَۖ ﴾ (الفتح :١٦).

**دووەم :** ئەم ئایەتانە تایبەتە بە ئەهلی کیتاب وەك جولەکە و گاور کاتێك سەرانە ئەدەن ئەوکاتە ناچار ناکرێن لەسەر موسڵمان بوون ، پاشان ئایەتەکان کافری بنەڕەتی دەگرێتەوە نەك مورتەد کەدەبێت ناچار بکرێـت بە گەڕانەوە بۆ دینەکەی یاخود کوشتنی.

**سێیەم :** ئەم ئایەتانە لە ڕیز بەندی هەڕەشە و ترساندن هاتوە هەروەك تەبەڕی لە ئبن و عەباسی دەگێڕێتەوە.

چوارەم : حوکمی ڕیدە کە کوشتنە چەسپاوە بەدەقی ئاشکرا و یەکلاکەرەوە .

**گومانی دووەم : گوایە ئەم ئایەتە ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴾(الكافرون :٦)مانای دان پێدانانە بە دینی کافرەکان کەواتە ئازادین لەپەیرەو کردنی ئایین :**

وەڵام : ئەم ئایەتە لەسوڕەتی کافرونە خۆ بەری کردن لە کافران دەخوازێت ، مانای (لکم دینکم) ئەوە نیە دانیان پێدابنێ بە مانەوەیان لەسەر کوفرەکەیان ، هەروەها نەسخ بونەوەشی بەهیچ شێویەك وەرناگیرێ ، چونکە خۆ بەری کردن لە کافران و دژایەتی کردنیان لە بنەماکانی دینە کە سەرجەم پێغەمبەرانی بۆهاتوون ئەمەشە مەبەست لە مانای ئایەتەکە.

ئبن و تەیمیە ئەفەرمێ : ( ليس في هذه الأية أنه رضي بدين المشركين ولا أهل الكتاب كما يظنه بعض الملحدين ، ولا أنه نهى عن جهادكم و جعلوها منسوخة بل فيها براءته من دينهم وهذا أمر محكم لايقبل النسخ ) [١]

---

[١] جواب الصحيح ( ٢ / ٣٠)

واتە : لەم ئایەتەدا مانای ئەوە نیە ڕازی بوبێت بە دینی موشریکەکان یان ئەهلی کیتاب وەك هەندێك لە مولحیدەکان ئەڵێن ، وە نە ئەوەشی تێدایە کە ڕێگری بکات لەجیهاد کردنیان یان نەسخی جیهادی کردبێتەوە ، بەڵکو خۆ بەری کردنی تێدایە لە دینەکەیان ئەمەش لە فەرمانە دامەزارو و ئاشکراکانە کە سڕینەوەی تێدا نابێت.

ئیبن قەیم ئەفەرمێ : ( تشمل هذه السورة النفي المحض فإنها سورة براءة من الشرك و مقصودها الأعظم البراءة المطلوبة بين الموحدين و المشركين لهذا أتى بالنفي في الجانبين تحقيقا للبراءة المطلوبة ، وهذة مسألة الشريفة من أهم المسائل وقد غلط خلائق وظنوا أنها منسوخة بآية السيف لاعتقادهم أن هذه الأية اقتضت التقرير لهم على دينهم أو إنها مخصوصة بمن يقر على دينه وهم أهل الكتاب ، وكلا القولين غلط محض ، فلا نسخ في السورة ولا تخصيص بل هي محكمة بل و يستحيل دخول النسخ فيها فإن أحكام التوحيد التي انقضت عليه دعوت الرسل يستحيل دخول النسخ فيه ، ومعاذ الله أن تكون الأية اقتضت تقريرا لهم أو إقرارا على دينهم أبدا بل لم يزل الرسول ﷺ في أول الأمر أشد على الإنكار عليهم وعيب دينهم وتقبيحه والنهي عنه وإنما الأية اقتضت البراءة المحضة وإن ما أنتم عليه من الدين لا نوافقكم عليه أبدا فإنه دين باطل )[1]

واتە : ئەم سوڕەتە پێکهاتوە لە نەفی کردنێکی تەواو ئەمە سوڕەتی بەرائەت کردنە لە شیرك ئامانجی گەورەی داواکردنی خۆبەری کردنە کە هەبێت لە نێوان یەکتاپەرستان وهاوبەش پەیداکەرەکان هەربۆیە لە هەردوو لادا بە نەفی هاتوە بۆ هاتنەجێی داواکردنی خۆبەری کردنەکە، ئەم پرسە پیرۆزە لە گرنگترین پرسەکانە، خەڵکانێکی زۆر هەڵەیان تێدا کردوە واگومانیان بردوە سڕابێتەوە بە ئایەتی شمشێر چونکە بیروباوەریان وابوو ئەم ئایەتە واتای هێشتنەوەیان ئەدا لەسەر دینەکەیان یان ئەوەی ئایەتەکە تایبەت کرابێ بەخاوەن پەیامەکان ، هەردوو ئەم ووتەیەش هەڵەیەکی ئاشکرایە نەسڕانەوە لە سوڕەتەکە هەیە نە تایبەت کردن بەڵکو ئەمە یەکێکە لەسورەتە دامەزراو و ئاشکراکان بەڵکو مەحاڵە تێچوونی سڕانەوە تیایدا ، چونکە ئەحکامەکانی تەوحید کە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بوە مەحاڵە سرانەوەی تێدا هەبێ، وە پەنا بەخوا ئەگەر ئەو ئایەتە مانای هێشتنەوەیان ببەخشێ لەسەر دینەکەیان یاخود دانیان پێدا بنێت لەسەر دینەکەیان ، بەلکو بەردەوام پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامەوە ئینکاری ئەکرد لێیان و عەیبی دەگرت لە دینەکەیان و ناشرینی دەکرد و نەهی لێ دەکرد ،وە ئایەتەکە مانای خۆبەری

[1] بدائع (٣٨/١)

کردنی تەواو دەخوازێت بەو مانایەی ئەو دینەی ئێوە لەسەرین بەهیچ شێوەیەك ڕازی نابین لێتان لەسەری چونکە دینێکی پوچ و نارەوایە.

**گومانی سێیەم : وا گومان دەبەن هەڵگەڕانەوە تەنها بریتیە لەوەی وازبێنی لە هەموو ئیسلام :**

وەڵام : نەخیر بەڵکو هەڵگەرانەوە لە ئیسلام بە ئەنجامدانی تەنها کردەوەیەك یان درکاندنی تەنها ووتەیەك دەبێت، وەك ئەوکەسانەی لە غەزوەی تەبوك تەنها ووشەیەکیان وت پێی کافربوون سەرەڕای ئەوەی صەحابە بوون و لە جیهادیش دا بوون ، زانایانیش کۆکن لەو بارەیەوە و لەباسی هەڵگەڕاوەدا دەیان ووتە و کردەوەیان باسکردووە کە ئینسانی موسڵمان بە ئەنجامدانی هەر یەکێك لەو ووتە و کردەوانە کافر دەبێت.

هەروەها گومانەکەیان پوچ ئەکاتەوە ئەو پیاوەی خێزانی باوکی خۆی مارە کردبوو پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی کە تەنها کردەوەیەك بوو ئەنجامی دابوو پێی مورتەد بوو ئەمەش بەڵگەیەترە.

**گومانی چوارەم : ئەڵێن کوشتنی تایبەتە بە مورتەدێك کە جەنگاوەر بێت(محارب) بەبەڵگەی فەرموودەی ( التارك لدينه ) :**

**یەکەم :** فەرموودەکە تایبەت نیە بە هەڵگەڕاوەی جەنگاوەر بەلکو جەنگاوەری سیفەتێکی ترە لەسەر هەڵگەرانەوە .

**دووەم :** پاشان بەڵگەی کوشتنی کەسی مورتەد خۆ  هەر ئەم فەرموودەیە نیە ، بەلکو چەندین فەرموودە و ڕووداوی تر هەیە لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی .

**سێیەم :** صەحابە پێش ئەوەی کوشتاری زەکات نەدەرەکان بکەن کافریان کردن هەر وەك لە بوخاری و موسلیم هاتوە : ( لما مات النبي ﷺ وارتدت العرب قال عمر لأبي بکر : كيف تقاتل الناس )بەوەش هەڵەی ئەو کەسانە دەرەکەوێ کە ئەڵێن صەحابە زەکات نەدەرەکانیان کافر نەکردبوو پێش کوشتار.

**گومانی پێنجەم : ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ حەدی ڕیدەی بەدەستی خۆی ئەنجام نەداوە :**

ئەم گومانەش وەك ئەوانەی پێشوو پوچ و نارەوایە بەلکو سابت بوە لە سونەتی کردەوەیی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو پێشتریش باسمان کرد ئەو کەسانەی پێغەمبەری خوا کوشتونی بەهۆی هەڵگەڕانەوەیان وەکوعورەنیەکان کە موسڵمان بوون پاشان هەڵهاتن چوونش وانەکەی پێغەمبەری خوایان کوشت و هەرچی ووشتر و مەرو ماڵات هەبوو سەریان بری تاڵانیان کرد ئەویش ناردی بەشوێنیان هێنران چۆن شوانەکەیان کوشتبوو بەهەمان شێوە کوژرانەوە لە صەحیحی بوخاری و موسلیم هاتوە بەدرێژی .

**گومانی شەشەم : ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ کەسی لە مونافیقەکان نەکوشتوە :**

وەڵامی ئەم گومانەمان لە کتێبی ( النفاق و احكام المنافقين داوەتەوە )

**گومانی حەوتەم : ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ حەدی ڕیدەی بەسەر ئەوکەسانەدا جێ بەجێ نەکرد کە خوای گەورە باسیان دەکات ﴿ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾(آل‌عمران :٧٢) :**

وەڵام ئەم ئایەتە باس لە مورتەدان ناکات بەڵکو باس لە کافرەکان دەکات کە ڕواڵەتی ئیسلام بونیان دەردەخست نەك موسڵمانێك کافر بوبێت.

**گومانی هەشتەم : ئەڵێن مەرجەکانی ئاشتەوایی حودەیبیە ئەوەی تێدا هاتوە ( ئەوەی لای موحمەد بێت بۆ ناو قورەیش ئەوا نایگێڕنەوە ) ئەگەر مورتەد دەکوژرێ پێغەمبەرﷺ وازی لێ نەدەهێنا :**

وەڵام : ئەمە تایبەتە بە خەلکانێك یان وڵاتێك لە جەنگ بن بەرامبەر ئیسلام ( أهل الحرب ) ئەوجا پەیوەندی کردنی مورتەد بەو وڵاتەوە کۆمەڵێك ئەحکامی تایبەت بەخۆی هەیە کە پێشتر باسمان کردوە. وە ئەوەی ئەم گومانەش ڕەت دەکاتەوە ئەو کەسانەیە کە پێغەمبەری خوا خۆێن ڕشتنیانی حەڵاڵ کردبوو کە هەڵگەرابونەوە و چوبونە مەککە وەك عبدالله ابن أبى السرح و إبن خطل.

**گومانی نۆیەم : بەسەرهاتی ئەو ئەعرابیەی هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ بەیعەتی پێدا لەسەر ئیسلام پاشان توشی نەخۆشی بوو لە مەدینە و هاتە لای پێغەمبەر ووتی پێغەمبەری خوا بەیعەتەکەم هەڵبوەشێنەوە و ڕازی نەبوو پاشان هاتەوە و ووتی بەیعەتەکەم هەڵبوەشێنەوە دیسان ڕازی نەبوو ئەعرابیەکەش دەرچوو ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ( المدینة کالکیر تنفي خبثها وینصع طیبها ). رواه البخاري.**

وەڵام : ئەوبەیعەتەی کە ئەعرابیەکە داوای کرد هەڵیبوەشێنیتەوە بەیعەتی کۆچککردن بوو نەك وازهێنانی لە ئیسلام، ئایا ئەشێت پێغەمبەر ﷺ مساوەمە بکات لە دینەکەی و ڕێگەی بدات هەڵگەڕێتەوە لە دینەکەی وازی لێ بێنێ و هەر بە موسڵمانی بزانی هەرچەندە بیەوێ واز لە ئیسلام بێنێ .

**وەبەڵگەش لەسەر ئەوەی بەیعەت لەسەر ئیسلام مەبەست پێی بەیعەت بوە لەسەر کۆچککردن ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەی لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی :** جاء إلی رسول الله ﷺ رجل من الإعراب فأسلم فبایعه علی الهجرة فلم یلبث أن حم فجاء إلی النبي ﷺ فقال : أقلني فقال : لا ، ثم أتاه فقال : اقلني ، فقال : لا أقیلك ، ثم أتاه فقال : أقلني فقال : لا ، ففر فقال النبي ﷺ ( المدینة کالکیر تنفي خبثها وینصع طیبها ).

واتە : پیاوێك لە ئەعرابیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوو ، پاشان بەیعەتی پێدا لەسەر کۆچکردن ، ئەوەنەی پێ نەچوو تاکو توشی نەخۆشی گرانەتا بوو ، و هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ووتی : بەیعەتەکەم هەلوەشێنەوە ، فەرمووی نا ، پاشان هاتەوە ووتی پەیعەتەکەم هەڵوەشێنەوە ئەویش فەرمووی : نا هەڵیناوەشێنمەوە ، پاشان هەڵهات و پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : مەدینە وەك کورەی ئاگر وایە پیسیەکان لائەبات و باشیەکانی کۆدەکاتەوە .

بەم جۆرە ئەو لەفزەی لە بوخاری هاتوە دەکرێتە سەر ئەم لەفزەی لە فەرموودەکەی جابر هاتوە فەرموودەکەی بوخاری ڕوون دەکاتەوە .

**گومانی دەیەم: بەڵگە هێنانەوەیان بەو ووتەیەی عومەر ﵁ کە دەربارەی چەن کەسێکی مورتەدی بنەماڵەی بەکری کوڕی وائیل کردبوی کاتێك پەیوەندیان بە بەکافرەکانەوەکردبوو ، فەرمووی : ( كنت عارضا عليهم الباب الذي خرجوا منه أن يدخلوا فيه ، فإن فعلوا ذلك قبلت منهم وإلا استودعتهم السجن ) رواه الصنعاني والبيهقي.**

وەڵام : ئەوەی قەولەی عومەر ﵁ دەربارەی ئەو کەسانە ئەوە نیە کە بەڵگەی پێ دێننەوە بەڵکو ئەوە پەیوەستە بە مورتەدی موحاریب (جەنگاوەر) ، مورتەدی جەنگاوەریش کە لەژێر دەسەڵاتی موسڵمانان نەبێت ئەحکامەکانی جیاوازە ، وە پێشتریش باسی عومەرمان کردوە کە چۆن فەرمانی کردوە بە کوشتنی هەڵگەڕاوەکان و چی فەرموە دەربارەیان وەك بەسەرهاتەکەی لەگەل ئەبو موسای ئەشعەری.

**گومانی یانزەهەم: ڕەخنەگرتنیان لە ئیجماع بە کوشتنی مورتەد بەهۆی ئەو جیاوازیەی لە ئیبڕاهیم و سەوری وەریانگرتوە ، ئیبراهیم فەرموویەتی سەبارەت بەکەسی مورتەد : (يستتاب أبدا )واتە/ هەموو کات داوای تەوبە دەکرێ لێی ، سەوریش فەرموویەتی : هەرئەمەشە ئێمە وەری دەگرین.أخرجه إبن أبی شيبة وعبدالرزاق.**

وەڵام : عیبرەت بە جیاوازی کەسەکان نیە مادام فەرمانەکە لو سونەت دا چەسپابێت و کۆدەنگی صەحابەی لەسەربێت.

هەروەها پێچەوانەی ئەوەش سابت بوە لە ئیبراهیمەوە کە بوخاری بەشێکی لە صەحیحەکەی هێناوە بەناونیشانی ( باب حكم المرتد والمرتدة وقال ابن عمر والزهري و إبراهيم : تقتل المرتدة ).

واتە : ابن عومەر و زوهری و ئیبراهیم فەرموویانە : مورتەدە ئەکوژرێت .

وە چەندین ڕیوایەتی ترمان هەیە ووشەی (أبدا) ڕوون دەکاتەوە لە ووتەکەی ئیبراهیم کە مەبەست لێی وەڵامدانەوەی ئەو کەسانە بوە کە داواکردنی تەوبە لەکەسی مورتەد بەهەندێك حاڵەت دەبەستنەوە ئەویش فەرموویەتی نەخێر هەمووکاتێ هەڵگەڕاوە داوای تەوبەی لێ دەکرێ ئەگەر تەوبەی نەکرد ئەوجا دەکوژرێت، نەك مەبەستی ئەوە بێت مورتەد نەکوژرێ. بەپێی ئەم گێرانەوانە ( يستتاب المرتد كلما إرتد ) داوای تەوبە لە مورتەد دەکرێ هەرکاتێ هەڵگەڕایەوە ، ( يستتاب المرتد كان أصله مسلما أو مشركا أسلم ثم ارتد )داوای تەوبە لە مورتەد دەکرێ جا سەرەتا موسڵمان بوبێت یان موشریك بوبێت موسڵمان بوبێت و هەڵگەڕابێتەوە .

**گومانی دوازدەهەم : ئەڵێن سەرپشك كردنی مورتەد لەنێوان موسڵمان بون یان كوشتن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام ئەوە ئیمانێكی زۆرە ملێی و ناچاریە لەژێر هەرەشەی كوشتن بۆیە ئەو ئیمان موسڵمانێتیە قبوڵ نیە :**

لەوەڵامدا ئەڵێین ئەمە ڕەتكردنەوەی سونەتە بە گوێرەی لێكدانەوەی عەقڵتان پاشان زانایان فەرموویانە ئەمە زۆر لێ كردنی حەقە بۆ دەرنەخستنی كوفر و هەڵنەگەرانەوەی كەسانی تر.

پاشان بەو كەسانە دەڵێین ئەی چی دەڵێن بەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرمێت : ( أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله ..)متفق عليه. واتە : فەرمانم پێكراوە كوشتاری خەڵك بكەم تاكو دەڵێن لا اله الا الله .

ئایا ئەمە زۆر لێ كردن نیە ، ئەمە ئەگەر بەرامبەر بە كافری بنەڕەتی بكرێ كە هیچ خوێنی نەپارێزێ تەنها چوونە نێو ئیسلام نەبێ كەواتە كوشتار كردنی هەڵگەڕاوە لە پێشترە تاكو بگەڕێتەوە بۆ دینەكەی.

وصلي اللهم وسلم على سيدنا و نبيينا محمد و على آله و صحبه إلى يوم الدين

## پێرست